# مافەکانی

# ژن و مێرد

نوزادی

# لە ئیسلام دا

چاپی چوارەم

ابو علي الكردي

منتدى اقرأ الثقافي

ئامادەکردنی

نەوا محمد سعید





# مافەکانی ژن و مێرد
# لە ئیسلام دا

نوسینگەی فریشتە

تایبەت بە وتارەکانی
مامۆستا عبدالصمد
مۆبایل: ٠٧٥٠٠٤٨٢٨٣٩٧

ناوی کتێب: مافەکانی ژن و مێرد لە ئیسلام دا
نوسەر: نەوا محمد سعید
بڵاوکردنەوەی نوسینگەی تەفسیر/ هەولێر
خەت: نەوزاد کۆیی
نەخشەسازی: عزالدین محمد عمر
بەرگ: أمین مخلص
ژمارەی چاپ: چوارەم
ساڵی چاپ: ١٤٣٤ك – ٢٠١٣ز
تیراژ: ٥٠٠٠ دانە

لە کتێبخانەی گشتی هەولێر ژمارەی سپاردنی ( ٣٨٣ ) ی ساڵی ٢٠٠٦ دراوەتێ



بسم الله الرحمن الرحيم

# پێشەكیی

الحمد لله رب العالمين والصلاة والسلام على رسول الله محمد وعلى آله وصحبه ومن تبعهم بإحسان الى يوم الدين وبعد:

هاوسەرگیریی پەیوەندیەكی پیرۆزی نێوان ژن‌و پیاوە، كە ئیسلام چەند یاساو مافێكی چەسپاندوە، بۆ بەردەوامیی‌و بەختەوەریی‌و ئاسودەیی‌و سۆزو خۆشەویستیی نێوانیان، هەروەها بۆ ئەوەی ئەو مافانەی، كە بەسەر یەكتریانەوە هەیە، ببێتە كەتەلۆكی ژیانی ڕۆژانەیان، تا خۆیانی پێ پێوەر بكەن‌و، ببێتە مایەی نەمانی كێشەو گرفتەكانیان. چونكە زۆر جار بەهۆی نەناسینی مافەكانەوە، كێشەو

گرفت دروست دەبێت، كە دەبێتە ئاستەنگ لەبەردەم بەختەوەریاندا.

ئەو مافانەی، كە باس دەكرێن، پێویستە هەریەك لە ژن‌و مێردی مسولمانی مولتەزیم‌و شوێنكەوتەی رێبازی پێغەمبەر ﷺ، لەسەر خۆی پیادە بكات‌و، لە خوای گەورە بترسێ لە بەجێنەهێنانی ئەم مافانە، كە خوای بەخشندەو پێغەمبەری ئازیز، دیاریان كردووە.

لە خوای گەورە داواخوازم تەقوامان پێ ببەخشێ و لە دینەكەی شارەزاترمان بكات‌و، بتوانین گشت یاساكانی پەیرەو بكەین.

نەوا محمد سعید

١٧ ربيع الثاني ١٤٢٩

٢٠٠٨/٤/٢٣

## داننان بە مافەکانی ژن؛

پێویستە لەسەر پیاوی مسوڵمان دان بە مافەکانی هاوسەرەکەی دا بێنێ، کە مافی بەسەرەوە هەیە، مافەکەش خوای گەورە بڕیاری لەسەر داوە،وەك دەفەرموێ: ﴿...وَلَهُنَّ مِثْلُ ٱلَّذِى عَلَيْهِنَّ بِٱلْمَعْرُوفِ...﴾ (البقرة-٢٢٨). واتە: ئافرەتان حەق‌و مافیان بەسەر پیاواندا هەیە بە چاکەکردن، وەك چۆن لەسەریانە مافەکانی پیاو بە چاکەکردن بەجێ بهێنن. پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرموێ: ((ألاَ إنَّ لَكُمْ على نسائِكُمْ حقّاً ولِنسائِكُمْ علَيكُمْ حقّاً)) رواه الترمذي ج٢، ص٣١٥، صحيح إبن ماجة ١٥٠١ (حسن)، واتە: پیاوان! ئێوە مافتان بەسەر ئافرەتەکانتان هەیە، هەروەها ئافرەتانیش مافیان بەسەرتانەوە هەیە. لەبەر ئەوە پیاوی مسوڵمانی ڕۆشنبیرو تێگەیشتوو، هەردەم هەوڵی

بەجێ هێنانی مافەکانی هاوسەرەکەی دەدات، چونکە بەجێ هێنانی مافەکانی ژن، خۆشەویستیی و ڕێزو میهرەبانیی و بەسۆزیی دەستەبەر دەکات، کە ئەمەش بنەمای بەردەوامیی ژیانی ژن و مێردی ئاسودەیە، خوای گەورەش دەفەرموێ: ﴿...وَجَعَلَ بَيْنَكُم مَّوَدَّةً وَرَحْمَةً...﴾(الروم- ٢١)، واتە: خوای گەورە لەنێوان ژن و مێرددا، خۆشەویستیی و ڕێزو سۆزو میهرەبانیی دروست کردووە. ئەمەی باسکرا، وەك سەرەتایەکی بەڵگەی شەرعیی مافەکانی ژن بوو. جا مافەکانی ژن بەسەر مێردەکەی بریتین لە:

١- گوزەران و ڕەفتارکردن بەچاکی: پێویستە پیاوی مسوڵمان لەگەڵ ژنەکەی، بە باشیی گوزەران بکات و ڕەفتاری جوان بێت لەگەڵیدا، وەك خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿..وَعَاشِرُوهُنَّ بِالْمَعْرُوفِ..﴾(النساء-١٩)

واتــە بــە چــاکەو بــە باشــیی مامەڵــەو گوزەرانیــان لەگەڵدا بکەن.

پێغەمبەریش ﷺ دەفـەرموێ: ((خَيْرُكُمْ، خَيْرُكُـمْ لأهلِـهِ، وأنـا خيرُكُـمْ لأهْلـي)) رواه الطبرانـي (صحيح)، واتــە: باشــترین کەســتان ئــەو کەســەیە، کــە لەگــەڵ هاوسەرەکەی باش بێ، منیش لـە هـەمووتان باشـترم بۆ هاوسەرەکەم.

کاتێـک ئیمـام عـەلی داخـوازی فـاطـیمەی کچـی پێغەمبەری کرد، پێغەمبەر ﷺ پێی فـەرموو: ((هي لك أن تحسن صــحبتها)) رواه الطبرانـي (صحيح) واتــە: فـاطــیمە بـۆ تۆیـە، بەمـەرجێ بـە باشـیی ڕەفتـاری لەگەڵدا بکەیت. هەروەها پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێ: ((أكمل المؤمنين ايماناً أحسنهم خلقاً، وخيارهم خيارهم لنســائِهِم)) رواه الترمـذي وحسـنه، واتــە: کامــڵ تــرین بــڕوای بــڕوادار ئەوەیــە، کــە ڕەوشــتی لــە هــەموان جــوانتر بــێ، باشترینیشــیان ئەوانــەن، کــە لەگــەڵ

هاوسەرەکانیان ڕەفتاریان جوانە. هەروەها دەفەرموێ: ((ألا واستوصوا بالنّساء خيراً)) متفق عليه، واتە: ئامۆژگاریتان دەکەم لەگەڵ ئافرەتان بە باشی هەڵس و کەوت بکەن و بۆیان باش بن.

بە باش ڕەفتار کردن لەگەڵ خێزان، بریتی یە لە قسە خۆشیی و نەرم و نیانیی و گاڵتە کردن لەگەڵی و ڕوخۆشیی وسوعبەت و پێکەنین، دیارە ئەمەش سیفەت و کاری پێغەمبەری خوا بووە لەگەڵ هاوسەرەکانی،کە پێویستە گشت مسوڵمانێکی مولتەزیم سیفەتی بەم شێوەیە بێت، کە پێغەمبەری خوا لەگەڵ خێزانەکانی پیادەی کردووە، ئەوەتا لە تەفسیری (إبن كثير) ج١ ص٤٦٦ دا هاتووە، کە پێغەمبەری خوا (جميل العشرة، دائم البشر يداعب أهله ويتلطف بهم ويوسعهم نفقة، ويضاحك نساءه حتى أنه كان اذا صلى العشاء يدخل منزله يسمر مع أهله قليلاً قبل أن ينام، يؤانسهم

بــذلك ﷺ، واتــە: بــە جـوانیی ڕەفتــاریی دەکــرد، هــەردەم ڕوخــۆش بــوو، گەمــەو گاڵتــەی لەگــەڵ خێزانەکەی دەکـردو نـەرمو نیـان بـوو، خـەرجی بـۆ زیاد دەکردن، هەروا بە قسەی خـۆش، هاوسـەرەکانی بـە پێکـەنین دەهێنـان، هەرکـە نوێـژی خـەوتنانی دەکرد، دەچووە ماڵیو لەگەڵ هاوسەرەکەی، کـەمێك قسـەی خۆشـی دەکـرد ،جـا پێغەمبـەر بـەم کـردەوە جوانانـە شادمانی دەکردن) .

٢- پێویسـتە لەسـەر پیـاوی مسـوڵمان بەچـاوی ڕێـزەوە سەیری هاوسـەرەکەی بکـات، نـابێ قسـەی ناشـیرینو جنێوی پێ بداتو نابێ لێی بدات، چونکە لێـدان لـە ئافرەت، خوورەوشـتی مسـوڵمانی مولتـەزیم نـی یـە. پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرموێ: ((ولا تضرب الوجه ولا تقبح ولا تهجر إلاّ في البيــت)) رواه أحمـد وأبـو داود حديث (حسن)، واتە: لە دەمو چاوی ئـافرەت مـەدەنو قسـەی ناشـرینی پـێ مـەڵێن. هـەروەها دەفـەرموێ:

((ولن يضرب خياركم)) اخرجه مالك. واتە: باشترین پیاوتان ئەوەیە، کە لە هاوسەرەکەی نادات، هەروا دەفەرموێ: ((ولا تضربوا إماء الله)) أخرجه أبو داود عن إياس بن عبدالله. واتە: لە ژنان مەدەن. خاتوو عائیشە (ڕەزای خوای لێ بێت) دەفەرموێ: ((ما ضرب رسول الله خادماً له ولا إمرأة)) أخرجه إبن ماجة في (سننه)، واتە: پێغەمبەری خوا، هەرگیز لە خزمەتکارو لە ئافرەتی نەداوە. جا کە پێغەمبەری خوا لە ئافرەتی نەدابێ، پێویستە لەسەر مسوڵمانان لە هاوسەرەکانیان نەدەن‌و کەسایەتی خۆیان لەدەست نەدەن، ئەو مسوڵمانەش، کە بەڵگە بۆ خۆی دروست دەکات، گوایە پێغەمبەر فەرموویەتی: ((لايسأل الرجل فيما ضربه إمرأته - پیاو پرسیاری لێ ناکرێ دەربارەی ئەوەی، کە لە ژنەکەی دەدات)) أخرجه أبو داود، ئەوا ئەم فەرموودەیە (ضعيف)ەو کاری پێ ناکرێ. ئەو لێدانەش، خوای گەورە لە

قورئاندا باسی دەکات بۆ قۆناغێکە، کە ئەم ئافرەتە تووشی (نشوز) دەبێت، واتە سەرپێچی مێردەکەی دەکات لە چاکەکاریو جێبەجێ نەکردنی مافەکانی، کە ئەمەش لە سێیەم قۆناغ بەکار دێت. قۆناغی یەکەم مێردەکەی ئامۆژگاریی بکات، کە لە خوا بترسێو مافەکانی جێبەجێ بکاتو سەرپێچی نەکات، ئەگینا خوای گەورە لێی ڕازی نابێت، جائەگەر ئامۆژگاری سوودی نەبوو، ئینجا قۆناغی دووەم بەکاردێت، کە بریتیە لە سەرجێی نەکردنی، گەر ئەمەش سوودی نەبوو، ئینجا قۆناغی سێیەم، کە لێدانە پیادە دەکرێت، بەلام چۆن لێدانێك، لێدانێك، کە لە دەمو چاوی نەداتو هیچ ئەندامێکی لەشی نەشکێنێ (لا تضرب الوجه)، لێدانەکەش بە مەبەستی تەمبێ کردنو هەڵە ڕاست کردنەوە بێت، نەك بە مەبەستی تۆڵەسەندنەوە، با لێدانەکەبە سەرینو پشتی بێتو لەسەرقەڕەوێڵەی نووستن

بێت، تاوەکو ببێتە گەمەو یاری، کە کۆتاییەکەی بە صولْح کۆتایی بێت.

٣- لەسەر پیاوی مسولْمان پێویستە،کە خواردن و خواردنەوەو پۆشاك وجل و بەرگ و خانوو لەسەر بنچینەی حەلاڵ بۆ خێزانەکەی دابین بکات، بەبێ منەت کردن و بەچاودادانەوە. ((قال رجل من الصحابة یا رسول الله ما حق زوجة أحدنا علیه؟ قال: أن تطعمها إذا طعمت وتکسوها إذا إکتسیت...)) رواه أبو داودحدیث (حسن)، واتە: یەکێك لە هاوەڵان گوتی: ئەی پێغەمبەری خوا! مافی خێزانی هەریەکێکمان بەسەرمانەوە چیە؟ پێغەمبەر فەرمووی: خواردنی بۆ دابین بکەیت و پۆشتەی بکەیت. هەروەها پێغەمبەری خوا، هانی مسولْمانان دەدات، کە بژێوی خێزانەکەی بدات، چونکە بە خێرو صەدەقە بۆی دەنووسرێ، بۆیە دەفەرموێ: ((إذا أنفقَ الرجل علی أهله نفقة یحتسبها فهي له صدقة)) متفق علیه، واتە:

گەر پیاو بژێوی خێزانەكەی بدات لە پێناوی خوای گەورە، ئەوا بۆی بە خێرو صەدەقە دەنوسرێ.

٤- پێویستە لەسەر پیاوی مسوڵمان، چاوپۆشیی لە هەڵەو كەم و كورتیەكانی هاوسەرەكەی بكات و، تەحەمولی نارەزایی یەكانی بكات و لێ ی ببورێ، چونكە گەر حەزی بە هەندێ ڕەوشتی خێزانەكەی نەكرد، ئەوا هەندێ ڕەوشتی جوانی تری هەیە، كە پیاو ڕازی دەكا،وەك پێغەمبەری خوا دەفەرموێ: ((لا يفركْ مؤمن مؤمنة، إن كره منها خلقاً رضـي منها آخر)) صحيح مسلم، ج٢، ص١٠٩١، واتە: پیاوی بڕوادار با ڕق وكینەی نەبێت بە ئافرەتی بڕوادار، گەر لە ڕەوشتی ڕازی نەبوو، ئەوا ڕەوشتێكی تری بە دڵەو ڕازی دەكات.

پێویستە پیاوی مسوڵمان ڕەچاوی دەرونی ئافرەت بكات، كە لە هەندێ حاڵەتدا دووچاری گرفت و نەخۆشیی و لەبیرچوون دەبێت،وەك حاڵەتی بێ

نوێـژیی (حـیض)، کـە کاردەکاتـە سـەردڵ و دەرون و جەستەو تێك دانی میزاجی ئافرەت.

**وێنەیـەك لـە چاوپۆشـیی:** لـە کتێبـی (الاسـلام والحیاة الجنسیة)ی دکتۆر محمود الشریف دا هاتووە: پیاوێـــك بـــە مەبەســـتی ســـکاڵاکردن لـــە دەنـــگ بەرزکردنەوەو دەم درێژی خێزانەکەی، چوو بۆ لای ئیمـامی عومـەر لـە ماڵەکەیـدا، جـا کـە گـوێی لـە خێزانەکـەی ئیمـامی عومـەر بـوو زمـان درێـژیی دەکرد، کـە ئیمـامی عومـەر بـێ دەنـگ بـوو، وەڵامـی نەدەدایـەوە. کـابرا دەڕوات، ئیمـامی عومـەر بـانگی دەکـات و پێـی دەڵێـت: براکـەم هـیچ ئیشـت هـەبوو؟ گوتی: هاتوم سکاڵای خێزانەکەمت لەلا بکەم، بـەڵام گوێم لە خێزانەکەت بوو، کە بە هەمان شـێوە زمـان درێژیی دەکرد!! ئیمامی عومەر گوتی: لەبـەر چـەند مافێـــك تەحـــەممولی قســـەکانیم کـــردووە، کـــە بەســـەرمەوەی هەیـــە: لەبەرئـــەوەی بۆتـــە چێشـــت

لێنەرو جل شۆرو شیردەری منداڵەكەم، كە ئەمانە هیچی لەسەر نی یە بیكات، هەروەها داوێنم لە حەرام دەپارێزێ. كەواتە براكەم، تۆش تەحەممولی بكە.

٥- پێویستە لەسەر پیاوی مسوڵمان پارێزگاریی لە شەرەفو ناموسو ئابڕوی خێزانەكەی بكات، نەهێڵێت سفور بێ‌وجلی ناشەرعیی بپۆشێ و تێكەڵی پیاوی بێگانە بێت، نەهێڵێ تەوقە لەگەڵ پیاوی بێگانە بكات، ڕێگا نەدات لە فەرمانەكانی خواو پێغەمبەر لابدات، بەڵكە دەبێ جێبەجێی بكات، چونكە پیاو بەرپرسیارە لە خێزانەكەی، وەك پێغەمبەری خوا دەفەرموێ: ((و یسأل الرجل عن أهل بیته)) رواه النسائي وابن حبان، واتە: پیاو سەبارەت بە خێزانەكەی لێی دەپرسرێتەوە، هەروەها دەفەرموێ: ((الرجل راع في أهله وهو مسؤل عن

رعيتـــه)) متفـق عليـه، واتــه: پيــاو بەرپرســيارە لــە خێزانەکەی‌و، بەرپرسيارە لە ماڵ‌و منداڵی.

کەواتــە دەبــێ پيــاوی مســوڵمان فــەرمان بــە خێزانەکــەی بکــات دينــی خــوا پــەيڕەو بکــات‌و، پارێزگـاريی لـە نوێـژەکان بکـات،وەکو خـوای گـەورە دەفــەرموێ: ﴿وَأْمُرْ أَهْلَكَ بِالصَّلَاةِ وَاصْطَبِرْ عَلَيْهَا...﴾ (طه- ١٣٢)، واتـە: فـەرمان بـە خێزانەکـەت بکـە بـە نوێژ کردن‌و، بەردەوام بە لەسـەر ئـەم فەرمانـە، کـە لەکاتی خۆی ئەنجام بدرێت.

٦- پێويستە لەسەر پياوی مسوڵمان، مافی خێزانەکەی بدات لە شارەزابوون‌و فێربوونی دينی خواو لە سـەر ئـەم فێربوونــەش، هـانی بـدات، جـا ئەگـەر خـۆی نـەيتوانی بـەم کـارە هەڵسـێ، ئـەوا دەبـێ ڕێگـە بـە خێزانەکــەی بــدات بــە ئامــادە بــوون لــە کــۆڕی شەرعيی‌و، فێر بوون لە مزگەوتـەکان بـە مەبەسـتی

شارەزابوون لە دینی خوا، دیارە زانستی شەرعیی فەرزە لەسەر پیاوو ژن، وەك پێغەمبەر دەفەرموێ: ((طلب العلم فريضة على كل مسلم)) رواه مسلم، سەبارەت بە رێگە نەگرتن دەفەرموێ: ((اذا استأذنت امرأة أحدكم الى المسجد فلا يمنعها)) أخرجه البخاري في صحيحه. واتە: گەر خێزانی هەریەكێك لە ئێوە ئیزنی خواست بۆ چوونە مزگەوت، با رێگەی لێ نەگرێت.هەروەها دەفەرموێ: ((لا تمنعوا اماء الله مساجد الله))، واتە: رێگە لە ئافرەتان مەگرن لە چوونیان بۆ مزگەوتەكان.

٧- پێویستە لەسەر پیاوی مسولْمان، رێگە بە هاوسەرەكەی بدات، سەردانی دایك‌و باوك‌و خزم‌و كەس‌و كارو دراوسێكانی بكات، چونكە سەردانی كردنیان لە ئیسلامدا بەواجب دانراوەو، مایەی بەدەستهێنانی بەهەشتە، پێغەمبەر دەفەرموێ: ((لا

یـدخل الجنّـة قـاطع)) رواه البخـاري ومسـلم، واتـه: ئـەو کەسـەی پەیوەنـدی خزمایـەتی ببچـڕێنێ ناچـێتە بەهەشـت. جا پیـاوی جـوامێرو مسـوڵمان، ڕێگـە بـە خـۆی نـادات، هاوســەرەکەی تووشـی گونـاهی ئـاوا گەورە ببێ.

٨- پێویستە لەسەر پیاوی مسوڵمان، نهێنیـی‌و عـەیب‌و کـەم‌و کـورتی هاوســەرەکەی بپۆشـێ‌و، لای هـیچ کەسـێك باسـی نەکات،تەنانـەت لای دایـك وبـاوکی و خوشـك وبـرای، بەتایبـەتی نهێنـی سـەرجێیی، کـە پێغەمبەری خوا ئەو جۆرە کەسانەی بـە خـراپترین کەس داناوە لە ڕۆژی قیامـەت،وەك دەفـەرموێ: ((إن من شرّ النّاس عند الله منزلةً يوم القيامة الرجـل يفضـي امرأتـه وتفضـي إليـه ثـم ينشـرها)) رواه مسلم، واتـه: خـراپترین کـەس لـە لای خـوای گـەورە لـە ڕۆژی قیامەت ئـەو پیاوەیـە، کـە نهێنـی سـەرجێیی لەگـەڵ

ژنەکەیی و، ئافرەت لەگەڵ مێردەکەی لەناو خەڵکی بڵاودەکاتەوە.

٩- پێویستە لەسەر پیاوی مسوڵمان وەك مافی بەسەریەوە هەیەو ،وەك هاوبەشی ژیانی، ڕاوێژ بە هاوسەرەکەی بکات، بەتایبەتی ئەو کارانەی تایبەتە بە ژیانیان، لە جوامێریی پیاویشە دان بەومافە دابنێت و، کەسایەتیی لە لای هاوسەرەکەی بەرز بێت. پێغەمبەری خوا ﷺ یەکێك بووە لەو کەسانەی،کە ڕاوێژی بەهاوسەری خۆی کردووە، ئەوەبوو کاتێك لە نووسینی (صلح الحديبية) بووەوە بە هاوەڵەکانی فەرمووو: (قوربانیەکانتان سەربڕن و سەرتان بتاشن)، بەڵام هیچ کەسێك ئەم فەرمانەی جێبەجێ نەکرد، جا پێغەمبەر چووە لای (أم سلمه)ی هاوسەری و ڕووداوەکەی بۆ گێڕایەوە، (أم سلمه) گوتی: تۆ لە پێش چاوی ئەواندا قوربانیەکەت سەربڕەو سەرت بتاشە. پێغەمبەریش

بە قسەی (أم سلمە)ی کرد، پاشان مسوڵمانەکان، کە ئەمەیان بینی، ئەوانیش هەستان قوربانیەکانیانی خۆیان سەربڕی‌و سەریان تاشی. ئەوەبوو ئەم ڕاوێژەی پێغەمبەر بە هاوسەرەکەی، خێرێکی گەورەی بەدوا داهات.

بەڵام لەناو خەڵکی عەوام ئەوە باوە، کە دەڵێ: (پرس بەژن بکەو بە قسەی مەکە) ، گوایە ئەمە فەرموودەی پێغەمبەرە (شاورهنّ وخالفوهنّ)، بەڵام ڕاستیەکەی ئەمە ئەوەیە،کە بە زمانی پێغەمبەر هەڵبەستراوەو (موضوع)ە.

١٠- لە مافی ئافرەتە بەسەر مێردەکەی، ڕاستەوخۆ دوای نوێژی عیشا بگەڕێتەوە ماڵەوە، نابێ شەوانە بە درەنگیی بچێتەوە ماڵ‌و کات بەبێ سوود لە دەرەوەی ماڵ بەسەر ببات، چونکە درەنگ هاتنەوە ماڵ، دڵە ڕاوکێ‌و چەندەها گومان بۆ خێزانەکەی دروست دەکات‌و هەراسانی دەکات، کە کار دەکاتە

سەر دڵ و دەروونی. هەروەها دەبێ هەستی خێزانەکەی ڕابگرێ و فەرامۆشی نەکات. دیارە درەنگ گەڕانەوە بۆ ماڵ نیشانەی فەرامۆش کردنە، کە دەبێتە هۆی سستبوونی پەیوەندی خۆشەویستیی ژن و مێرد. ئەوەتا پێغەمبەری خوا نارەزایی دەردەبڕێ بەرامبەر بە عەبدوڵڵای کوڕی عومەر، کە شەوانە درەنگ دەچووە ماڵەوەو نەدەچووە لای خێزانەکەی، جا پێی فەرموو: ((ان لزوجك عليكَ حقاً)) متفق عليه، واتە: هاوسەرەکەت مافی بەسەرتەوە هەیە. لەو مافەش ئەوەیە، کە لەگەڵی جووت بێ بۆیە پێویستە لەسەر پیاو خێزانەکەی لە جووت بوون تێر بکات، وەك چۆن لەسەریەتی لە نان و خواردن تێری بکات).

کەواتە نابێ پیاو ئەم مافە فەرامۆش بکات ،چونکە پێغەمبەری خوا زۆر نارازی بووە بەو کەسانەی،کە خۆیان لە هاوسەرەکانیان دوور

خستۆتەوەو، لەگەڵیان دا جووت نابن بە بیانووی خۆ یەكلا كردنەوە بۆ عیبادەت.

١١- پێویستە پیاوی مسوڵمان، خۆی بو هاوسەرەكەی جوان بكاتو خۆی بۆن خۆش بكات و جلی جوانورێكوپێك لەبەربكات وجلەكانی ئوتوبكات وزووو زوو خۆی بشوات .ئیبن عەبباس كوڕی مامی پێغەمبەروزانای ئوممەت، گوتویەتی: (إني أحب أن أتزين للمرأة كما أحب أن تتزين لي)، واتە: حەزدەكەم خۆم بۆ هاوسەرەكەم جوان بكەم، هەرووەك چۆن حەزدەكەم خۆییم بۆ جوان بكات. هەروا نابێ خواردنی بۆن ناخۆشیوەك سیرو پیازو كەوەرو هاوشێوەیان بخوات بەتایبەتی،لەوكاتانەی دەیانەوێ جیماع بكەن، چونكە بۆنی ناخۆش دەبێتە هۆی دوركەوتنەوەو بێزران لەیەكتریی.

١٢- پێویستە لەسەر پیاوی مسوڵمان، گەر لە ژنێك زیاتر هاوسەری بوو، دادگەریان لە نێواندا جێبەجێ بکات، دادگەریش لە خواردن و خواردنەوەو جل و بەرگ و خانووو نۆرەمانەوە جێبەجێ دەکرێت، بەڵام لە خۆشەویستیدا دادگەریی جێبەجێ ناکرێ، چونکە خۆشویستن لەسەروی ویستی مرۆڤە، تەنانەت پێغەمبەر نەیتوانیوە هەموو هاوسەرەکانی وەك یەك خۆش بوێت.

پێغەمبەری خوا دەفەرموێ: ((من كانت له امرأتان فلم يعدل بينهما جاء يوم القيامة أحد شقيه ساقطاً أو مائلاً)) رواه أحمد وأبو داود وابن ماجه والنسائي، واتە هەر پیاوێك دوو ژنی هاوسەر بوو، دادگەری لە نێوانیان دا جێ بەجێ نەکات، ئەوا لە ڕۆژی قیامەت بەشانی خوارەوە دێتە پێش. ئیمام شەوکانی شەرع ناس سەبارەت بەم فەرموودەیە دەڵێ: ((ئەمە بەڵگەیە لەسەر مەیل دان بەلای ژنێکی ترەوە لە

لایەنی ئەوشتانەی، کە پیاو پێی دەکرێ ئەنجامی بدات وەکو نۆرەمانەوەو خواردن و جل و بەرگ). نیل الأوطار للشوكاني، ج٦، ص٢١٦.

جا گەر پیاو دادگەریی لە نێوان هاوسەرەکانی جێبەجێ نەکرد، ئەوا دەبێتە پیاوێکی ستەمکارو زاڵم، کە خوای گەورە زوڵمی حەڕام کردووە، ئەو هەڕەشانەی سەبارەت بە ستەمکاران هاتووە، پیاوی نادادگەریش دەگرێتەوە.

جا، ئەوانەی باسکران چەند مافێکی ژن بوو بەسەر پیاوان، کە ئیسلام فەرمان دەکات ئەو مافانە بەبێ کەمتەرخەمیی جێبەجێ بکرێ، تاوەکو ژیانێکی بەختەوەریی ژن و مێردایەتی لەگەڵ یەکتریی ببرێتە سەر.

**کەواتە هاوسەری مسوڵمان!**

**گەر دەتەوێ سۆزو هەست و سەرنجی خێزانەکەت بۆ لای خۆت ڕابکێشی، ئەم مافانە جێبەجێ بکە.**

دیاره پیاویش چەند مافێكی بەسەر ژنەكەیەوە هەیە، كە دەبێ ئافرەتی مسوڵمان جێبەجێی بكات، گەر بیەوێ بەهەشتی خوای دەست كەوێ، چونكە بەهەشت بەڕەزامەندی مێردەكەی بەندە،وەك پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێ: ((إذا صلَّتِ المرأة خمسَها وصامت شهرها وحفظت فرجها وأطاعت زوجها قيل لها أدخلي الجنة من أي أبوابها شئتِ)) صحيح الجامع الصغير، ٦٦٠، واتە: گەر ژن پێنج نوێژەكانی ئەنجامداو، مانگی ڕەمەزان بەڕۆژوو بوو، داوێنی خۆی لە خراپە پاراست‌و گوێڕایەڵی مێردەكەی لە چاكە كرد، ئەوا پێی دەگوترێ: بڕۆ بۆ بەهەشت، لە هەر دەرگایەكەوە، كە ئارەزوو دەكەی. هەروەها دەفەرموێ: ((أيما امرأة ماتت وزوجها عنها راض دخلت الجنّة)) رواه الترمذي (صحيح)، واتە: هەر ژنێك بمرێ‌و مێردەكەی لێی ڕازی بێ دەچێتە بەهەشت.

ئافرەتێك دەچێتە لای پێغەمبەری خوا بۆ هەندێ پێویستیی، پێغەمبەری خوا ﷺ پێی دەفەرموێ: مێردت هەیە؟ ئەویش دەڵێ: بەڵێ، پێغەمبەر ئاگاداری دەكاتەوە، كە سەرپێچی مێردەكەی لە چاكە نەكات وبەقسەی بكات، چونكە سەرپێچیكردنی ئاگرەو، گوێڕایەڵیكردنی بەهەشتی پێ دەست دەكەوێ، كە دەفەرموێ: ((فإنه جنّتكِ ونارُكِ)) رواه الترمذي وسنده صحيح.واته:مێردەكەت،بەهەشت و دۆزەختە هەروا دەفەرموێ: ((إثنان لا تتجاوز صلاتهما رؤوسهما: "وامرأة عصت زوجها حتى ترجع")) رواه الطبراني والحاكم (جيد) واتە: دووكەس نوێژەكەیان لەسەریان زیاتر بەرز نابێتەوە، یەكێكیان ئافرەتێكە، كە سەرپێچیی مێردەكەی دەكات لە چاكە داوبەقسەی ناكات، تا ئەو كاتەی دەگەڕێتەوەو پەشیمان دەبێتەوە.

## مافەكانی پیاو بەسەر ژنەكەی ئەمانەن:

١- پێویستە لەسەر ئافرەتی مێرددداری مسولْمان، گوێ ڕایەڵیی مێردەكەی بكات لە هەموو شتێكدا، گەر گوناهو تاوان نەبێ، چونكە گوێڕایەڵیی، دەبێ تەنها لە چاكەكاریدا بكرێت. پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێ: ((لا طاعــة لمخلـوق في معصــية الخــالق)) رواه أحمد في المسند، واتە: گوێرایەڵیی بۆ كەسێك نیە، گەر ئەو كەسە لە سەرپێچیی خوا دابێت.

جا ئەگەرمێرد داوای فڕێدانی سەرپۆش، یان دەرخستنی ڕازاوەیی بۆ پیاوی بێگانەی لێ بكات، یان بیەوێ لەكاتی حەیزدا لەگەڵی جووت ببێ، یان لەدواوەی لە ڕێی كۆمیەوە بچێتە لای،یان هەرشتێ،كە خواو پێغەمبەرصلى الله عليه وسلم پێیان ناخۆشە، نابێ گوێڕایەڵیی مێردەكەی بكات.وەك پێغەمبەر دەفەرموێ: ((من أتى حائضاً،

أو امرأةً في دبرها أو كاهناً فصدّقهُ بما يقول فقد كفر بما أنزل على محمد)) صحيح (آداب الزفاف، ٣١)، واتە هەر پیاوێك لەگەڵ ژنی حەیزداری جوت ببێ، یان بچێتە لای ژنەكەی‌و لە دواوەی جوت ببێ، یان بچێتە لای فاڵچییەك‌و بڕوای پێ بكات، ئەوا باوەڕی بەوە نیە، كە بۆ پێغەمبەر هاتووە. هەروەها دەفەرموێ: ((ملعون من أتى امرأة في دبرها)) سنن ابي داود، ج٦، ص١٩٨، واتە: ئەو كەسە لە ڕەحمەتی خوا بێبەشە، كە لە دواوە دەچێتە لای ژنەكەی.

٢- پێویستە لەسەر ئافرەتی مێرد‌داری مسوڵمان، شەرەف‌و ئابڕووی مێردەكەی بپارێزێ‌و، پارێزگاری لە ماڵ‌و سامان‌و كەل‌و پەلی ناو ماڵ‌و، چاودێری منداڵەكانی بكات، خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿...فَٱلصَّٰلِحَٰتُ قَٰنِتَٰتٌ حَٰفِظَٰتٌ لِّلۡغَيۡبِ بِمَا حَفِظَ ٱللَّهُۚ ...﴾(النساء- ٣٤)، واتە: ئافرەتی (صالحة)

ئەوانەن، کە گوێ ڕایەڵی مێردەکانیان دەکەن، کاتێك مێردەکانیان لە لایان نابن، ئابڕوو ماڵ و منداڵیان دەپارێزن. پێغەمبەریش ﷺ دەفەرموێ: ((والمرأة راعية في بيت زوجها ومسؤولة عن رعيتها)) متفق عليه، واتە: ژن لە ماڵی مێردەکەی بەرپرسیارە، هەروا لە ماڵ و منداڵەکەشی بەرپرسیارە.

٣- پێویستە لەسەر ئافرەتی مێرددار، خۆی بۆ مێردەکەی جوان بکات و ڕوو بەخەندەو قسەخۆش بێت و گرژ نەبێت و ببێتە مایەی حەساندنەوەی مێردەکەی و زمان درێژیی لەسەر نەکات. هەروەها بەشێوەیەك خۆی نیشانی مێردەکەی نەدات، کە مێردەکەی حەزی پێ ناکات، چونکە پیاو حەز دەکات هەردەم خێزانەکەی خۆی بۆ جوان بکات و جل و بەرگی پاك وخاوێن وجوان وڕازاوەی بۆ لەبەر بکات، کە خۆی حەزی پێ دەکات و چاوی پێ ڕون دەبێت، پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێ: ((خير النساءِ مَن

تسرّك إذا أبصرت، وتطيعك إذا أمرت، وتحفظ غيبتـك في نفسها ومالك)) اخرجه الطبراني من حديث عبدالله بن سـلام (صـحيح) صـحيح الجـامع الصـغير، ٣٢٩٩، واتــه: باشـترین ئـافرەت ئەوەیـە، کـە تەماشـات کـرد دڵـت خـۆش بکـات‌و بـە قسـەت بکـات، کـاتێکیش لـە مـاڵ نابێت، خۆی‌و داراییت دەپارێزێ.

دیـارە خـۆ جـوانکردن‌و بـۆن خۆشـیی، یـەك لـەو شتانەیە پیاو دڵی پێ خۆش دەبێت‌و خۆشەویستیی بـۆ زیـاتر دەبێـت، چـونکە ئەوکاتـە، پیـاو وا هەسـت دەکات، کە هاوسەرەکەی ڕێزی دەگرێت‌و گرنگیی پێ دەدات. ئـیبن عەبباسـیش دەفـەرموێ: حـەز دەکـەم خۆم بۆ خێزانەکـەم جوان بکـەم، وەك حـەز دەکـەم ئەویش خۆی بۆم جوان بکات. بەڵام جێی داخە زۆر لە ئافرەتان، ئەم مافە گرنگەیان فەرامۆش کـردووەو بەشێوەیەك خۆیان نیشانی مێردەکانیـان دەدەن، بـە جلێکـی بـۆن چێشـتاویی‌و بـە قـژێکی ئـاڵۆزاوی، کـە

دەبێتـــە هــۆی دووركەوتنـــەوەی مێردەكانیـــان.
ئەوجۆرە ئافرەتانە،وا دەزانن لە خواترسان ئەوەیـە، كـە خـۆی فـەراموۆش بكـات و جلـی جـوان و ڕازاوە بـۆ مێردەكەی لەبەر نەكات و خۆی كزۆڵ بكات.

لەڕاستیدا، ئافرەتی لە خـواترس، دەبـێ ئـارەزووی مێردەكەی بێنێتە دی و خۆی بۆ جوان بكات و چاوی تێـــر بكات،بەتایبـــەتی لـــەڕۆژگاری ئەمڕۆمانـــدا دەبینین،ئافرەتـانی لەخوانـەترس وبـێ پـەروەردە، جلێكی وا لەبەر دەكەن، كە پیاوان لەخشتە دەبەن و ســەرنجیان بۆخۆیـــان ڕادەكێشـــن وبونەتـــە هــۆی بڵاوبونەوەی فەسادو خراپەكاریی.لەبەرئـەوە دەبـێ ئافرەتی موحەجەبە و باڵاپۆش، هونەریی خـۆی بـۆ مێردەكـەی ڕانـوێنێ و تەفـەنون بكـات لـە هـەڵس وكەوت وڕەفتاری جوانی مێیایەتی خۆی.

٤- پێویســتە لەســەر ئــافرەتی مێــرددار، هــەر كاتێـك مێردەكەی داوای سەرجێیی (جووت بوون)ی لێكـرد،

یەکسەر بەدەم داواکەیەوە بچێت‌و سەرپێچیی نەکات، با ئەو کاتەش کاتی نان کردن بێت، چونکە ئەمە کارێکی زۆر هەستیارەو دەبێ جێبەجێ بکرێت، ئەگینا ئافرەتەکە وەبەر خەشم‌و توڕەیی خوای گەورەو لەعنەتی فریشتەکان دەکەوێت، وەك پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێ: ((والذي نفسي بيده ما من رجل يدعو امرأته الى فراشه فتأبى عليه إلا كان الذي في السماء ساخطاً عليها حتّى يرضى عنها)) رواه البخاري ومسلم، واتە: سوێندم بەو کەسەی،کە گیانمی بەدەستە، هەر پیاوێك داوا لە خێزانەکەی بکات بۆ سەرجێیی‌و خێزانەکەی قەدەغەی بکات‌و بەدەم داواکەیەوە نەچێت، ئەوا خوای گەورە لێی توڕەیە، هەتا ئەو کاتەی مێردەکەی لێی ڕازی دەبێ.

هەروەها دەفەرموێ: ((إذا دعا الرجل إمرأته الى فراشه فلم تأته فبات غضبان عليها لعنتها الملائكة حتى تصبح)) متفق عليه، واتە: گەر پیاو داوای لە ژنەکەی کرد بۆ سەر جێیی، خێزانەکەشی بەدەم داواکەیەوە

نەچێ و پیاوەکە لێی توڕە بێ، ئەوا هەتا بەیانی، فریشتەکان لەعنەتی لێ دەکەن، هەروا دەفەرموێ: ((إذا دعا الرجل زوجته لحاجته فلتأته وإن كانت على التنور)) رواه النسائي والترمذي (صحيح) صحيح الجامع الصغير، ٥٣٤، واتە: گەر پیاو داوای لە هاوسەرەکەی کرد بۆ جووت بوون، با هاوسەرەکەی بەدەمیەوە بچێت، ئەگەر لەسەر تەندور و سێری نان کردن بێت.

کەواتە ئافرەتی صالحە ئەو ئافرەتەیە، خۆی لەم هەموو هەڕەشانە دەپارێزێت و مێردەکەی ڕازی دەکات و، ناهێڵێ مێردەکەی توشی داوێن پیسی ببێت، یان توشی نەزەرو ڕوانینی حەڕام بێت.

٥- مافی پیاو لەسەر ژنەکەی ئەوەیە، بەبێ ئیزنی ئەو نەچێتە دەرەوە، گەر بۆ مزگەوتیش بێ. ئەوەتا پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێ: ((...حقه عليها أن لا تخرج من بيتها إلا بأذنه...)) المجموع شرح المذهب، في فقه

الشافعية، ج١٥، ص٥٧٦، واتە: مافی پیاو لەسەر خێزانەکەی ئەوەیە، بەبێ ئیزنی ئەو لە ماڵ نەچێتە دەرەوە.

هەروەها لە فەرمودەیەکی تر دەفەرموێ: (( ولا تخرج من بيتها إلا بإذنه فإن فعلت لعنتها ملائكة السّماء وملائكة الرحمة، وملائكة العذاب حتى ترجع...)) رواه الطبراني عن إبن عبّاس (حسن الأسرة) صديق حسن خان، ص١٠٥، واتە: ئافرەت بەبێ ئیزنی مێردەکەی نەچێتە دەرەوە، گەر چووە دەرەوە فریشتەکانی ئاسمان‌و فریشتەکانی ڕەحمەت‌و فریشتەکانی عەزاب لەعنەتی لێ دەکەن، تا ئەو کاتەی دەگەڕێتەوە.بەلاَم پیاویش نابێ ئەم ئیزنە ئیستغلال بکات و ژنەکەی مەنع بکات لەچونە ماڵی باوکی،گەرمەنعی بکات،ئەوا ژنەکە بۆی هەیە بەبێ ئیزنی مێردەکەی سەردانی ماڵی باوکی بکات،چونکە مەنع کردنی ژن بۆماڵی باوکی،سەرپێچیی و

مەعسیەتە، پێغەمبەریش صلى الله عليه وسلم فەرمویەتی:نابێ گوێڕایەڵی كەسێك بكرێت،كەلەسەرپێچی خوادابێت .

٦- مافی پیاو لەسەر ژنەكەی ئەوەیە بەبێ ئیزنی ئەو، كەسێك نەیەتە ماڵەكەی، كە خۆی حەزی پێ ناكات، عن أبي هريرة أن رسول الله قال: (( **ولا تأذن في بيته إلا بإذنه..**)) أخرجه البخاري في صحيحة، ج٩، ص٢٩٥، واتە: حەڵاڵ نیە بەبێ ئیزنی مێردەكەی، هیچ كەسێك بێتە ماڵەكەی.

كەواتە گەر پیاو حەزی نەدەكرد (فلان) بێتە ماڵەكەی، با هاوسەرەكەی نەهێڵێ ئەو كەسە بێتە ماڵەكەی.

٧- پێویستە لەسەر ئافرەتی مێرددار، بەبێ ئیزنی مێردەكەی ڕۆژووی سوننەت نەگرێ، گەر بەڕۆژوو بو، مێردەكەی بۆی هەیە پێی بشكێنێ، پێغەمبەر

دەفەرموێ: ((لا يحلّ للمرأة أن تصوم وزوجها شاهد إلا بإذنه)) صحيح البخاري بشرح العسقلاني، ج٩، ص٤٩٣، لە ڕیوایەتێكی تردا دەفەرموێ: ((لا تصوم إمرأة وزوجها شاهد يوماً من غير رمضان إلا بإذنه)) سنن ابي داود، ج٧، ص١٤٧، جامع الترمذي، ج٣، ص٤٩٥، سنن إبن ماجة، ج١، ص٥٦٠.

بەڵام ئەگەر مێردەكەی چوو بۆ سەفەر ئەوا بۆی هەیە بەڕۆژوو ببێ، بەڵام بۆ ڕۆژووی فەرز (رمضان) ئیزنی مێرد پێویست نیە.

٨- ئافرەتی مێرددار، نابێ بەبێ ئیزنی مێردەكەی، لە ماڵی مێردەكەی ببەخشێ و خەرج بكات، وەك پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێ: ((ولا تنفق إمرأة شيئاً من بيت زوجها إلا بإذن زوجها، قيل: ولا الطعام؟ قال:"ذلك أفضل أموالنا")) حديث حسن صحيح إبن ماجة، ١٨٩٥. واتە: ژن لە ماڵی مێردەكەی نابێ هیچ شتێكی لێ ببەخشێ، مەگەر بە ئیزنی مێردەكەی

بێت، گوتیان: خواردەمەنیش؟ فەرمووی: ئەمە باشترین ماڵمانە.

٩- گەر ئافرەت ماڵ و سامانی هەبوو، یارمەتی مێردەکەی داو بۆ منداڵەکانی خەرج کرد، نابێ منەت بەسەر مێردەکەی بکات، منەت کردن سیفەتێکی زۆر ناشیرینەو دەبێتە هۆی لەدەست دانی پاداشت و، خوای گەورەش بەچاوی ڕەحمەت تەماشای منەتکاران ناکات. خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ لَا تُبۡطِلُواْ صَدَقَٰتِكُم بِٱلۡمَنِّ وَٱلۡأَذَىٰ...﴾ (البقرة- ٢٦٤)، واتە ئەی ئەو کەسانەی بڕواتان هێناوە، خێرو صەدەقەکانتان بە منەت و گوتنەوەو بەچاو دادانەوە بەتاڵ مەکەنەوە. پێغەمبەریش ﷺ دەربارەی ئەوانەی چاکە لەگەڵ خەڵکی دەکەن و، پاشان بەچاویان دادەنەوە، دەفەرموێ: (ثلاثة لا يكلمهم الله يوم القيامة، ولا ينظر إليهم، ولا يُزَكيهم،

ولهم عذاب أليم، قال: فقرأها رسول الله ﷺ ثلاث مرّات، قال: أبو ذر خابوا وخَسِروا، مَنْ هُمْ يا رسول الله؟ قال: المُسْبِلُ، والمَنَّان، والمُنفِقُ سِلْعتَه بالحِلْفِ الكاذب) رواه مسلم.

لەم فەرموودەیە ئەوە دەردەکەوێ، کە منەتکەر یەك لەو کەسانەیە، کە خوا لە ڕۆژی قیامەت قسەیان لەگەڵ ناکات و تەماشایان ناکات و، پاکیان ناکاتەوەو سزای بە ئێشیان بۆ هەیە.

١٠- پێویستە لەسەر ئافرەتی مێرددار، ئارام لەسەر هەژاریی مێردەکەی بگرێ و، بە کەم ڕازی بێت و قەناعەت بکات بەوەندەی، کە هەیە، داوای شتێك لە مێردەکەی نەکات، کە لەسەرووی توانای دایە، خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿...سَيَجْعَلُ ٱللَّهُ بَعْدَ عُسْرٍ يُسْرًا...﴾(الطلاق- ٧)، واتە: خوای گەورە دوای

ناخۆشیی و گرانیی، خۆشی بەدوادا دێنێ. دیارە قەناعەتیش گەنجینەیەکە، لەناو ناچێ.

١١- پێویستە لەسەر ئافرەتی مێرددار، هەڵسێ بە چاك پەروەردەکردنی منداڵەکانی بە هێمنیی و لەسەرخۆیی و نەرم و نیانیی و تورە نەبوون لێیان و نەگوتنی قسەی ناشیرین و جنێو نەدان و دوعای خراپ نەکردن بۆیان، چونکە بەم ڕەفتارانە ئازار بە دڵی مێردەکەی دەگات، پێغەمبەریش دەفەرمووێ: ((لا تؤذين إمرأة زوجها في الدنيا إلاّ قالت زوجته من حور عين: لا تؤذيه قاتَلَكِ الله، فإنما هو دَخيلٌ عندكِ يوشك أن يفارقكِ إلينا)) رواه الترمذي وحسنه وهو كما قال، ج٢، ص٣٢٠، رقم ١١٨٤.

واتە: لە دنیادا هەر ئافرەتێك ئازاری مێردەکەی بدات ئەوا ئەو حۆریەی، کە بە هاوسەر دانراوە بۆ ئەو پیاوە ،دەڵێ: ئازاری مەدە ،هەی خوا بتکوژێ،

ئەو پیاوە لای تۆ ئەمانەتە، هێندەی نەماوە لە لاتو بێتە لامان.

١٢- یەكێك لە مافی مێرد بەسەر هاوسەرەكەی ئەوەیە، ڕێزی دایكو باوكو خزمەكانی بگرێو، ڕەفتاری لە گەڵیاندا جوان بێ، پیاویش بە هەمان شێوە ڕێزی دایكو باوكو خزمەكانی خێزانەكەی بگرێ، چونكە ئەمەش مافە بەسەریەوە.

١٣- پێویستە لەسەر ئافرەتی مێرددار، نهێنی یەكانی كاروباری مێردەكەی بپارێزێو، لە لای هیچ كەسێك نەیدركێنێ، بە هیچ كلۆجێك باسی نەكات،بەتایبەتیی نهێنی شەوانەو سەرجێی. گەر نهێنی یەكانی دركاند، ئەوا لە ڕۆژی قیامەتدا دەبێتە خراپترین كەس لای خوای گەورە، وەك پێغەمبەر  دەفەرموێ: ((إن من شرّ النّاس منزلة يوم

القيامة الرجل يفضي إمرأته وتفضي إليه ثمّ ينشر سرّها)) رواه مسلم.

١٤- ئافرەتی مێرددار، نابێ بەبێ هۆو بەبێ بەڵگە داوای تەڵاق لە مێردەکەی بکات، جا ئەگەر بەبێ هۆ داوای کرد، ئەوا بۆنی بەهەشتی لەسەر حەرام دەبێت، وەك پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێ: ((إيّما إمرأة سألت زوجها الطلاق من غير بأس فحرامٌ عليها رائحة الجنّة)) رواه أحمد في المسند والترمذي (صحيح).

# سەرچاوەكان

١- واجبات المرأة المسلمة في ضوء القرآن والسنة، إعداد وتصنيف الشيخ خالد عبدالرحمن العك، الطبعة الأولى ,١٩٩٨

٢- تحفة العروس، أو الزواج الإسلامي السعيد، محمود مهدي الأستانبولي، الطبعة الرابعة.

٣- المفصل في أحكام المرأة والبيت المسلم في الشريعة الإسلامية، د.عبدالكريم زيدان، الجزء السابع، الطبعة الثانية ,١٩٩٤

٤- رسائل الأفراح، الرسالة الثانية للنساء فقط، عبدالإله آل جار الله، الطبعة الأولى ١٩٩٢.

